# ڕاپۆرتی:
# ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی
# کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

عەلی باپیر

چاپی یەکەم

١٤٣١ ك ٢٠١٠ ز






# ڕاپۆرتی
# ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی
# کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان




# ڕاپۆرتی:

# ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی
# کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان

عەلی باپیر

چاپی یەکەم

١٤٣١ك ٢٠١٠ز

ameer.maktab@yahoo.com



ناوی نامیـــــــلــکـە: ڕاپۆرتی: ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسـلامیی کوردسـتان

نوســـــــــــەر: عــەلی بـاپیر

دیزاینـــی نـــاوەوە: عزالدين محمد

بــــــــــەرگ: عزالدين محمد

نـۆرە و سـاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز

تــــــــــیراژ: (٢٠٠٠) دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣٧٨) ساڵی (٢٠١٠)ی پێ دراوە

## پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على جميع الأنبياء والمرسلين، خصوصاً سيدهم وخاتمهم محمد المبعوث رحمة للعالمين وآله المهتدين بهداه أجمعين.

بەڕێزان ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامیی، برایان خوشکان! السلام عليكم ورحمة الله

ئەم نامیلکەیەی بەردەستتان دەقی ئەو وتارەیە کە لە کۆنگرەی دووەمی[1] کۆمەڵی ئیسلامیی دا وەك ڕاپۆرتێکی ئیمانیی و سیاسیی و فیکریی بەناوی مەکتەبی سیاسییەوە پێشکەشم کرد.

شایانی باسە کە لەبەر کەمیی کاتی تەرخانکراو نەگونجاوە بەتێرو تەسەلیی قسە لەسەر بابەتەکان بکەین و زیاتر بە کورتی پوختیی و گوشراویی قسە کراوەو

---

١) کە لە ڕۆژانی : (١٥و١٦و١٧)ی تەمووزدا لە هەولێر بەسترا.

شەرح و شیکردنەوەی زیاتری بابەتەکان حەواڵەی عەقڵ و سەلیقەی خۆتان و ئەو کتێب و بەرهەمانەم دەکەم کە لەو بابەتانەوە خستوومنەڕوو.

هیواداریشم هەموو لایەکمان لە هەموو ئاستەکاندا بەو چوارچێوەو هێڵە گشتییانەوە پابەند بین کە لە دوو توێی ئەم وتارو ڕاپۆرتەدا هاتوون. چ لە ڕووی ئیمانیی و مەعنەوییی و چ لە ڕووی فیکریی و چ لە ڕووی سیاسییەوە.

لە خوای بە بەزەیی و بەخشەریش وەپاڕێمەوە کە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ لە هیدایەت و تۆفیق و یارمەتی خۆی بۆمان زیاد بکات و وامان لێ بکات کە شایستەی ئەوە بین پاکسازیی و چاکسازیی یەکی ڕیشەیی لە کۆمەڵگاکەماندا ئەنجام بدەین لەسەر ئاستی کوردستان و عێراقیش.

والسلام علينا وعلى عباد الله الصالحين

٢٧ی شەوالی ١٤٣٢ ك

٦ ی تشرین یەکەمی ٢٠١٠ ز

هەولێر

السلام عليكم و رحمة الله و بركاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على حبيبنا وشفيعنا امام المتقين وقائد المجاهدين محمد وآله اجمعين، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم باحسان الى يوم الدين.

سەرەتا بەخێرهاتنی گەرمی هەموو لایەك دەكەم، برایانو خوشكانی بەڕێزمان، وە لە خوای پەروەردگار داواكارم ئەم كۆنگرەیەمان ئەو ئامانجو مەبەستەی كە بۆی گرێ دراوە، بە باشترین شێوە بێنێتە دی، كە بریتییە لە گەشەپێدانو بەرەو پێشبردنو فراوانتركردنو چاكتركردنی كۆمەڵی ئیسلامی، كە كۆمەڵی ئیسلامیش خۆی بە خزمەتكاری دینو ژینی خەڵكو میللەتەكەی دەزانێت، لە چوارچێوەی هەرێمی كوردستانو عێراقیشدا.

بەڕێزان من لە چوار تەوەرەی سەرەکیدا وتارو ڕاپۆرتەکەم عەرزی ئێوەی بەڕێز دەکەم، بەڵام سەرەتا بە پێویستی دەزانم کە هەموو لایەکمان پڕ بە دڵ دوعای خێر بکەین بۆ شەهیدە سەربەرزەکانمان: خوایە بە لوتفو کەرەمی خۆت، بە ناوە هەرە چاکەکانتو بە سیفەتە هەرە بەرزەکانت، لێت دەپاڕێینەوە کە پلەی شەهیدەکانمان بەرزو بەرزتر بکەیەوە، (کە بە تەئکید ئەم واقیعەی ئێستا بەشێکە لە بەرهەمی خەباتو بەرخۆردانو فیداکاریی شەهیدە سەربەرزەکانمان) خوایە بە چاکترین شێوە پاداشتیان بدەیەوە، وە پاداشتی کەسوکاریان بدەیەوە، شەهیدەکانمان، وە کەسانێکیش کە بە زوڵمو ستەم زیندانی کران، بنەماڵەو کەسوکاریان زۆر خەمو ناسۆریان بۆ هەڵگرتن، خوایە بە باشترین شێوە پاداشتیان بدەیەوە.

بە پێویستیشی دەزانم کە سوپاسی پڕ بە دڵ ئاراستەی پێشمەرگە دێرینەکانمان بکەم، کە بەڕاستی

فیداكاریی ئەوان، خەبات‌و شەونخونی ئەوان بوو، كە بوو بە داینەمۆو جووڵێنەری ئەم حاڵەتە ئیسلامییەی كە لە كوردستاندا هەیە، خوا پاداشتیان بداتەوە، چ ئەوانەیان كە ساغ‌و سەلامەت دەرچوون، چ ئەوانەیان بەتایبەت كە كەمئەندام بوون، هەروەها سوپاسی سەركردایەتی پێشوو، ئەوانەی كە لە كۆنگرەی یەكەمدا، متمانەیان پێدرا، سەركردایەتی‌و مەكتەبی سیاسی، بە پێویستی دەزانم كە زۆر سوپاسیان بكەم، كە بە ڕاستی هاوكاری باش بوون، كە ئەم كارو كاروانە ئیسلامییەیان گەیاندە ئەم مەنزڵگایە، بە زۆر هەڵەت‌و هەڵدێردا هێنایان، زۆر هەورازو نشێویان بڕی، زۆر ناڕەحەتی‌و موعاناتیان بینی، خۆڕاگر بوون، نەلەخشاو بوون، خوا بەچاكترین شێوە پاداشتیان بداتەوە، ئێمەش پێویستە وەفاو سوپاسمان هەبێت بۆیان.

هەروەها سوپاسی تێكڕای ئەندامان، مشوور خۆران، بە وردو درشتیانەوە، لە مەكتەبەكان، لە مەڵبەندەكان، لە

هــەموو دەزگــاو بەشــەكان، دەكــەم، خــوا پاداشــتیان بداتەوە، كە بە تەئكید بە هاوكاری هەموو لایەك ئەم كارو كاروانو پرۆژە ئیسلامییە بەمرۆ گەیشتوە.

وە زۆر سوپاسی كەسانێكیش دەكەین كە لە دەرەوەی چوارچێوەی حیزب لەگەڵماندا مشوور خۆر بـوون، هاوكـار بوون، دڵسۆز بوون، كە وەكو زۆرجار گوتوومە هەیانـە لـە ئەندامێكی مەكتەبی سیاسی، یاخود سەركردایەتی كـەمتر دڵــسۆزییو مــشوورخۆریی نــەنوادوە، خــوا پاداشــتیان بداتەوە، ئەوانەی كە بە پێـشنیاریان، بـە ڕەخنـەیان، بـە تێبینییــان، بــە دڵــسۆزییان، بــە هاوكــاری مــاددییو مەعنەوییان، پشتگیرو هاوكارو دەست بارگرمان بوون.

هــــەروەها زۆر سوپاســــی خــــەڵكو جــــەماوەرە مسوڵمانەكەمان دەكەم، كە لەگەڵماندا بوون، لـە هـەورازو نشێوەكان، لە ناڕەحەتییەكان، لە گرفتو نەهامەتییەكاندا لەگـەڵمان بـوون، نـەك تـەنها بـۆ دەنـگ دانـەكانو بـۆ

ڕێپێوانەكان، بەڵكو بۆ خەم خواردن، بۆ ناڕەحەتی تەحەممول كردن لەگەڵماندا بوون، خوا پاداشتی هەموو لایەكیان بداتەوە.

وە پاشانیش سوپاسی لیژنەی باڵای ئامادەكاریی‌و سەرپەرشتیاری كۆنگرە دەكەم، وە هەموو لیژنەكانی دیكە، وە هەموو ئەو بەڕێزانەی كە هاوكار بوون، بۆ سەركەوتووانە ئەنجامدانی كۆبوونە گشتییەكان، وە كۆنفرانسە ناوچەییەكان، وە خوا پشتیوان بێ بە ئەنجام گەیاندن‌و سەرخستنی ئەم كۆنگرەیەش.

دێمە سەر تەوەرەی یەكەمی وتارەكەم، كە تەوەرەیەكی ئیمانیە، لەژێر ناونیشانی (بیرخستنەوەو ئامۆژگاری)دا .

## تەوەرەی یەکەم

## تەوەرەیەکی ئیمانییە، لەژێر ناوونیشانی:

## (بیرخستنەوەو ئامۆژگاری)دا

براو خوشکە بەڕێزەکانم!

تایبەتمەندیی ئێمە، جیاکەرەوەی ئێمە وەکو ئیسلامیی، لە خەڵك، لە خەڵکی دیکەی کە لەگەڵماندا لە کۆمەڵگاکەماندا دەژین، ئەوەیە کە ئێمە ئیسلامیین، واتە ئێمە بە ئیسلام ڕێ دەکەین، لە ئیسلامەوە بڕیارەکانمان سەرچاوە دەگرن، ئاڕاستەکانمان هەڵدەهێنجین، وە بۆ ئیسلام حەرەکەت دەکەین، وە لە چوارچێوەی ئیسلامدا دەمانەوێت جمو جۆڵ بکەین، وە لەژێر چەترو سایەو سێبەری ئیسلامیشدا، دەمانەوێت میللەتەکەمان بەختەوەربکەین، بەختەوەری دنیا، سەرفرازی دواڕۆژ.

بۆیە بەر لە هەر شتێ، پێویستە ئێمە ڕاستییە ئیمانییەكانمان هەمیشە لە دڵو مێشكدا درەوشاوە بن، هەمیشە لەبیرمان بن:

**<u>یەكەم ڕاستیی:</u>** كە من دەمەوێ بیر خۆمو ئێوەشی بهێنمەوە، ئەوەیە كە ئێمە بۆ تاقیكرانەوە خولقێنراوین، خوا (سبحانەو تعالی) لە سێ سوورەتی قورئاندا ئەم ڕاستییە دوپات دەكاتەوە: لە سوورەتی (هود) ئایەتی (٧)داو لە سوورەتی (الكهف) ئایەتی (٧)دا، وە لە سوورەتی (الملك) ئایەتی (٢)دا.

بۆ نموونە: لە سوورەتی (الملك)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ..﴿٢﴾ الملك﴾، واتە: ئەو خوایەی كە ژیانو مردنی گێڕاون، تاكو تاقییتان بكاتەوە كامەتان كردەوەی باشترە، كەواتە با بزانین ئێمە هەمیشە لەژێر چاودێری داین، لە تاقیكردنەوە داین، وەكو چۆن ئێستا ئێمە لەم هۆڵەدا

كۆبووینەتەوە، بەهەمان شێوە لە هۆڵێكی گەورەتریش دایـن، كـە ئـەم سـەر زەمینەیـە، بـە مەبەسـتی تاقیكرانەوە، بەچی تاقی دەكرێینەوە؟ بەوە كە داخۆ كامـەمان دەتـوانێ كـردەوەی باشـتر ئـەنجام بـدات، كردەوەش (عمل) لە بەكارهێنانی قورئاندا، هەم نیەتی نێـو دڵ، هـەم دەربـڕینی زمـان، هـەم جموجـۆڵی ئەندامەكانیش دەگرێتەوە.

**<u>ڕاستیی دووەم:</u>** كە دەمەوێت بیر خۆم و ئێوەشی بخەمەوە ئەوەیە كە، ئێمە بە ئیمان لە دنیادا بەختەوەر دەبین و لە دواڕۆژدا سەرفراز دەبین، خوا دەفەرموێ:

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ المؤمنون﴾، واتـە: بـە ڕاسـتی ئیمانداران سەرفراز بوون، ئیمانیش ئەو حەقیقەتانەیە، كە خوا ناردوونی، لە ڕێی وەحییەوەو بـە عـەقڵ دەرك دەكرێن و، بە دڵ قبووڵ دەكرێن و پەسەند دەكرێن و بە زمـان دانیـان پێـدادەهێنرێ، وە بـە جەسـتەو بـە

ئەندامەکانیش جێبەجێ دەکرێن، ئیمان دەبێ هەر چوار پێکهێنەرەکەی هەبن.

ڕاستیی سێیەم: ئەوەیە کە ئێمەبە تەقوا لای خوا خۆشەویست دەبین‌و بە تەقوا دەبینە بە دۆستی خوا، خوا (سبحانەو تعالی) دەفەرموێ:

﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ يونس﴾، واتە: ئاگادار بن دۆستانی خوا نە ترسیان لەسەرە، نە پەژارە دادەگرن‌و خەفەت دەخۆن، ئنجا ئایا ئەوانە کێن؟ ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴾، ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو پارێزیان دەکرد. پارێزکردن یانی چی؟ یانی: لەخۆ وریا بوون، شتێك نەکەی خوا پێی ناخۆش بێ، جا خوا دوو شتی پێ ناخۆشن: فەرزەکانی بچوێنی‌و قەدەغەکانی بشکێنی.

کەواتە: تەقوا پابەندیی بە شەریعەتەوە، هەمووی دەگرێتەوە.

راغیبی ئەصفەهانی لە پێناسەی تەقوادا دەڵێ:

(وصار التقوى في اصطلاح الشرع حِفْظُ النفس عما يُؤْثِمُ)، واتە: تەقوا لە زاراوەی شەرعدا بریتییە لە خۆپاراستن لە هەر شتێکی گوناهبارکەر.

ئنجا ئینسان بە دوو شت گوناهبار دەبێ:

* شتێ خوا فەرزی کردوە بیچوێنێ.

* وە شتێ کە قەدەغەی کردوە، توخنی بکەوێو قەدەغەکانی خوا بشکێنێ.

بەڵێ ئەگەر ئەهلی ئیمانو تەقوا بین، بە ئەندازەی ئیمانو تەقوامان هەیە، ئەهلی خواینو دۆستی خواین، (سبحانەو تعالى) و ئاشکراشە کە خوا دۆستەکانی خۆی خۆشدەوێو لێیان ڕازییەو ڕازیشیان دەکات،

دیارە ڕەزامەندیی خواش بەڕاستی بەرزترین هیواو گەورەترین مەبەستێكە، كە ئینسان لە دنیادا بەدەستی بێنی، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿... وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ...﴾ التوبة ٧٢، ئایا چ شتێك لەوە گەورەترە تۆ لە دنیادا خوا بە پەسندكراوی لە قەڵەم بداتو لێت ڕازی بێ، وە لە دواڕۆژدا بتخاتە شوێنێكەوە كە بۆ دۆستە پەسندەكانی خۆی ئامادەی كردوە كە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەكاننی؟!

<u>ڕاستیی چوارەم:</u> بریتییە لە ئەخلاقو ڕەوشتی بەرزو جوان:

بەڕێزان! برایانو خوشكان!

ئەگەر تەقوا لە ئیمان پەیدا دەبێت، ئەخلاقیش بەراستی لە تەقواو لە ئیمانەوە پەیدا دەبێ، خوا (سبحانەو تعالی) لە سوورەتی ابراهیم دا دەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ إبراهيم ﴾، دەفەرموێ: سەرنج نادەی چۆن خوا (سبحانە و تعالى) وێنەی وشەیەکی بەرزو بە پێزی هێناوەتەوە، بە درەختێکی بەرەکەتدارو بەرهەمدار، ڕەگو ڕیشەکەی لە زەویدا چەسپاوەو لقو پۆپەکەی بەرەو ئاسمان بەرزبۆتەوە، هەمیشە بەرومیوە دەردەکات بە فەرمانی پەروەردگاری، دیارە ڕەگو ریشەکە ئیمانو عەقیدەیەو، لقو پۆپەکان طاعەتو پابەندییە بە شەریعەتەوەو، میوەو بەرهەمی درەختەکەش، کە درەختی دینداریی‌و موسڵمانەتی یە بریتییە لە ئەخلاقو ئاکارو ڕەوشتی جوانو پەسەند.

ئنجا ئێمە بە ئەخلاقی جوان، برایانو خوشکانی بەڕێز! دەبینە خۆشەویستی خوا، تەماشا بکەن خوا چی دەفەرموێت: لە سوورەی بەقەرە ئایەتی (٢٢٢)دا دەفەرموێ:

﴿... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾، واتە: بێگومان خوا کەسانێکی خۆشدەوێ کە زۆر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، وە کەسانێك کە خۆیان پاك دەکەنەوە، لە چی؟ لە شتی خراپ، لە پیسی ماددیی‌و مەعنەویی خۆیان پاك دەکەنەوە، هەروەها خوا هەر لە سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: ﴿وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾، واتە: وەچاکە بکەن، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێ، دەتەوێ خوا خۆشی بوێی؟ چاکەکار بە، چاکە بڵێ‌و چاکە بکە، لەگەڵ هەموو کەس، بەڵکو لەگەڵ هەموو مەخلووقەکان.

پێغەمبەری ئێمە (علیه الصلاة والسلام)، نازناوو عینوانێك کە پێی دەناسرێت چییە؟ ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ الأنبياء﴾، پێغەمبەری ئێمە سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێ، تەنیا ڕەحمەتی

بەرجەستەی خوا نەبوو بۆ ئیمانداران، بەڵكو بۆ هەموو جیهانیان بە كافرو موسڵمانەوە، بەڵكو بە جنۆو ئینسەوە، بەڵكو هەندێ لە زانایان دەڵێن بۆ ژیاندارانو دارو درەختیش، چونكە بە هاتنی موحەممەد (علیە الصلاة والسلام)و هێنانی ئەو پەیامە خواییە، مەخلووقات هەمووی كەوتنە حاڵەتی سیلمو ئاشتی لەگەڵ یەكتر، كەوتنە حاڵەتی تەبایی، عەدالەت چەسپی، بەڵێ تێكڕای ناڕێكییەكان لادەچن، كاتێ شەریعەتی موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) كە خوا پێیدا ناردوە بەرقەرار دەبێ.

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿...وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ آل عمران﴾، واتە: خوا خۆڕاگرانی خۆشدەوێ، وە فەرموویەتی: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ آل عمران﴾، واتە: خوا ئەوانەی خۆشدەوێ كە پشت بە خوا دەبەستن.

کەواتە بە لەخۆدا هێنانەدی ڕەوشتو سیفەتە بەرزو پەسەندەکان دەبینە خۆشەویستی خوا، هەروەها دەبینە خۆشەویستی خەڵکیش، چونکە خوا (سبحانەو تعالی) دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ (٣٤) فصلت﴾، واتە: چاکەو خراپە وەك یەك نین، بە کام خەسڵەتەی هەرە چاکە شتی خراپ پاڵ پێوە بنێ (ئەگەر کەسێك قسەی خراپی لەگەڵ کردی، هەڵوێستێکی خراپی لە بەرامبەردا نواندی، بە کامە خەسڵەتی جوانوچاکترە، بە کامە تەعبیری بەرزو شیرینترە، خراپەکەی ئەو دەفع بکە) ﴿فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾، کەسێك کە لە نێوانی تۆو ئەودا دوژمنایەتی هەیە، دەبێتە دۆستێکی نزیك، (خۆشی دەوێی چونکە هەست دەکات بە چاکەی تۆ بەسەر خۆیەوە) هەڵبەتە ئەوەش

بەڕاستی بۆ هەموو كەس مەیسەر نابێ، زەخت لەخۆكردن‌و فشار لەخۆكردنی دەوێ، ئەمەش بێگومان لە مەیدانی مامەڵەكردن دایە، نەك لە مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەدا، نەك لە مەیدانی شەڕ پێ فرۆشتناندا، كە ئەوە بازاڕێكی دیكەیەو یاسایەكی دیكەی پێویستە.

پاشان ئێمە بە ئەخلاق‌و ڕەوشتی جوان ئیمانی خۆمان تەواو دەكەین، بەڵكو بەڵگەو شایەت لەسەر تەواویی ئیمان پەیدا دەكەین، پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام دەفەرموێت: **((ان من خیاركم أحسنكم خلقاً))** رواه البخاري ومسلم، لە چاكترینتان ئەوانەن كە ئەخلاقیان جوانترە، ڕەوشتیان بەرزو پەسەندترە، هەروەها دەفەرموێت: **((اكمل المؤمنین ایمانا احسنهم خلقا، وخیاركم خیاركم لنسائهم))** ترمذي گێڕاویەتەوەو بە صەحیحی داناوە، دەفەرموێ: ئیمان تەواوترین ئیمانداران ئەخلاق جوانترینیانە، (سەنگی مەحەكی

ئیمان بریتییە لە ئەخلاق، بریتییە لە ڕەوشتی بەرزو پەسەند. دەتەوێ خۆت هەڵسەنگێنی ئیمانت چەندە دینداریت چەندە؟ بزانە ئەخلاقت چۆنە، ئاکارت چۆنە؟ ڕەفتارت چۆنە؟ لەگەڵ خۆتدا، لەگەڵ دەوروبەرت، لەگەڵ دۆستو دوژمنت لە هەموو بازنەکاندا، وە دەفەرموێت: باشترینتان باشترینتانن بۆ هاوسەرانتان، بە ڕاستی ئەخلاقی بەرز لە مامەڵەکردنی ئینسان لەگەڵ هاوسەریدا زیاتر دەردەکەوێ، بۆیە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) وا دەفەرموێت.

ڕاستیی پێنجەم: کە دەمەوێ بیر خۆمو ئێوەشی بخەمەوە، ئێمە دەبێ برایەتیو ڕێزو خۆشەویستیو دڵسۆزی بۆ یەك لە هەموو بازنەکاندا لە ئەولەویەتی کارمان بێت، لە هەموو بازنەکاندا، واتە: بازنەی کۆمەڵی ئیسلامییدا، لە بازنەی تەوژمی ئیسلامییدا، لە بازنەی خەڵکە موسڵمانەکەماندا، لەسەر ئاستی هەرێم، لەسەر ئاستی عێراق، لە بازنەی موسڵمانانی دیکەی

دەورووبەرو دونیادا، ئێمە پێویستە بە برایەتی، بە دڵسۆزیی، بە ڕێزو خۆشەویستی لەگەڵ یەکدا ڕەفتار بکەین، چونکە خوا (سبحانەو تعالی) نازناوی برایەتی بۆ ئێمە بڕیارداوە ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ... ﴿١٠﴾ الحجرات﴾، ﴿ إِنَّمَا ﴾ ئەداتی حەصرو ئیثباتی پێدەڵێن: واتە بڕواداران بەس بران، ئەگەر بڕوادارو، ئیماندار بن، دەبێ پێکەوە بەس برا بن، یاخود هەر بڕواداران بران، واتە: برای ڕاستەقینە، ئەگینا خەڵکی تریش لەگەڵماندا برایە، ئەوەش کە ئیمانی بە ئیسلام نیە براتە بەڵام برای قەومییتە، برای نەژادیی‌و ڕەگەزییتە، وەکو خوا دەفەرموێت: ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ... ﴿٦٥﴾ الأعراف﴾ ،﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ... ﴿٧٣﴾ الأعراف﴾، ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ... ﴿٨٥﴾ الأعراف﴾، لە حاڵێکدا کە هیچ کام لە (عاد)و

(سەموود)و (مەدیەن) بڕوایان بە (هود)و (صالح)و (شعیب) –علیهم السلام– نەهێناوە، بەڵام خوا بە برایانی لەقەڵەم داون، واتە لە ڕەگەزو لە ڕەچەڵەكو نەسەبەوە برا بوون، بەڵام برایەتیی ئیمانییو عەقیدەیی برایەتییەكی تەواوە، برایەتییەكی بەردەوامە.

**ڕاستیی شەشەم:** ئەوەیە كە ئێمە خۆمان بە خاوەنی كەموكووڕیی بزانین، بەڵام بەبێ نائومێد بوون.

هەر كەسێك لافی ئەوە لێبدات كە هەڵەو كەموكووڕیی نیە خۆی نەناسیوە، خوا (سبحانەو تعالى) دەفەرموێت: ﴿... فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ ﴿٣٢﴾ النجم﴾، واتە: خۆتان تەزكیە مەكەن، خوا زاناترە بەوەی پارێزكارە، واتە خۆتان پێ چاك نەبێ، جا خۆ تەزكیە كردن بە قسە، نەهی لێكراوە، بەڵام خۆ تەزكیەكردن بەكردەوە فەرمانی پێكراوە،

یانی چی؟ یانی: بە قسە مەڵێ چاكم، بەڵام بە كردەوە خۆت چاك بكە، خوا دەفەرموێ : ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ الشمس﴾، واتـە: بەڕاستی ئـەو كەسـەی خـۆی پـاكو چـاك كـردوە سـەرفرازە، ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤ الأعلى﴾، واتـە: بەڕاسـتی ئـەو كەسـەی خـۆی تەزكیـە دەكات، خـۆی پـاكو چـاك كـردوە، سـەرفرازە، بـەڵێ، ئێمـە دەبـێ خۆمـان بـە هەڵـەكارو گوناهبـار بـزانین، بەشـەر وایـە پێغەمبـەر (علیـه الـصلاة والـسلام) فەرموویـەتی: ((كـل بـني آدم خطـاء))، واتـە: هـەموو ئادەمیزادەكـان خـەتاكارن، هەڵـەكارن، بـەڵكو زۆر هەڵەكارن، (خَطّـاء) صـیغەی موبالەغـەی (خـاطيء)ە، واتـە: زۆر هەڵـە دەكـەن، بـەڵام ((وخـير الخطـائين التوابون)) رواه أبو داود، باشترین هەڵـەكاران ئەوانـەن كـە دەگەڕێنـەوە، ئەماشـا بكـەن بـراو خوشـكە بەڕێزەكان، تەماشای سـەروەری پێغەمبـەران (محمـد)

(علیه الصلاة والسلام) بكەن، وە تەماشای هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بكەن، ویردی سەر زمانیان گەڕانەوە لای خوایە، تەوبەكردنو، پەشێمان بوونەوەیە، داوای لێبووردن كردنە لە خوا، هەر لە ئادەمەوە تا خاتەم، ئەوە چ دەگەیەنێ؟ ئەوە دەگەیەنێ كە پێغەمبەران، وەنەبێ لە هەموو خەڵك گوناهبارتر بووبن، نەخێر، لە هەموو كەس چاكتر بوون، لە هەموو كەس بێ گوناهتر بوون، بەڵكو گوناه بەو مەفهوومەی ئێمە هەر نەیانبووە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەسەر ڕای زۆربەی زانایان گوناهی گچكەشیان نەبووە، بەڵكو بەس هەڵەی ئیجتیهادییان هەبووە، بەڵام ئینسان تا لە خوا نزیكتربێ، خۆی بە كەمتەرخەمتر دەزانێ، چونكە تا لە خوا نزیكتر بی، زیاتر دەزانی، خوا چەند گەورەیە (سبحانەو تعالی)، چەند بەرزە، چەند مەزنە، چەند چاكەی شایستەیە، چەند بەندایەتی بێ خلتەی

شایستەیە، زیاتر هەست بە خەتاباریی‌و گوناهباریی خۆت دەکەی، بەڵام بە پێچەوانەوەوە هەتا لە خوا دوورتر بی، خۆت پێ چاکتر دەبێ، بەڵێ هەتا لە خوا نزیکتربی زیاتر هەست بە کەمتەرخەمیی خۆت دەکەی، بۆیە پێغەمبەری ئێمە (علیه الصلاة والسلام) سڵاوی نوێژی دەدایەوە (٣) جار پێش هەموو شتێ دەیفەرموو: ((استغفر الله، استغفر الله، استغفر الله))، دەیفەرموو: داوای لێبوردن لەخوا دەکەم، وە لە کاتێکدا کە گەورەترین کاری ئەنجامدا لە نیوەدوورگەی عەرەبییدا کە بریتی بوو لە ئازادکردنی مەککە، قەڵای شیرک‌و کوفر، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمویَ چی؟

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ

تَوَّابًا ﴿٣﴾ النصر﴾، واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، هەرکات یارمەتی خوا هاتو دەروازەکانی شاری مەککە کرانەوە، وەخەڵکت بینی پۆل پۆل هاتنە نێو ئاییینی خواوە، ئەوە بە ستایش کردنەوە پەروەردگارت بەپاك بگرەو داوای لێبوردنی لێبکە بەڕاستی خوا زۆر تۆبە وەرگرە.

ئێمەش دەبێ وابین، دەبێ خۆمان بە هەڵەکارو کرچو کاڵو گوناهبار بزانین، بەڵام نائومێد نەبین...نائومێد نەبین لە خۆمان، دەست لە خۆمان نەشۆین، چونکە شەیتان بۆ دوو شت لە ئینساندا دەگەڕێ:

١- لە ڕەحمەتی خوا نائومێدی بکات، لە کاتی هەڵەو گوناهدا.

٢- بە کردەوەی چاکی خۆی مەغروری بکاو لەخۆی بایی بکات لە کاتی چاکەو طاعەتدا.

**ڕاستیی حەوتەمو کۆتایی:** ئەوەیە کە ئێمە باوەڕمان بە خۆمان بێو متمانەمان بە خۆمان بێ، بەڵام بەبێ لەخۆبایی بوون، هەر کەس باوەڕی بە خۆی نەبێ، متمانەی بەخۆی نەبێ، هیچی لە دەست نایە، هەیە وادەزانێ ئینسانی پارێزکارو صالح ئەوەیە بڵێ: من هیچ نیم، هەر هیچم پێ ناکرێ. کەسێك خۆی بە هیچ دانێ هەر دەبێتە هیچ، نەء، خۆت پێ هیچ نەبێ، تۆ شتی، ئەتۆ شتێکی خوا دروستی کردووی، بەڵام خۆت پێ هەموو شت نەبێ، خۆت پێ شت بێ، بەڵام خۆت پێ هەموو شت نەبێ، باوەڕت بە خۆت بێ، بەڵام لە خۆت بایی مەبە، ئێمە دەبێ وابین، خوا (سبحانەو تعالى): لەسەر زمانی (یعقوب) (علیه السلام) فەرموویەتی: ﴿...وَلَا تَأْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ یوسف﴾، واتە: نائومێد مەبن لە بەزەیی خوا، بێگومان تەنیا

كەسانی بێبڕوا لە بەزەیی خوا نائومێد دەبن، وە پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) دەربارەی ئەوە كە بڕوادار دەبێ متمانەو باوەڕی بەخۆی بێ، سیقەی بەخۆی بێ، دەفەرموێ: **((المؤمن القوي خير واحب الى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير، احرص على ما ينفعك واستعن بالله ولا تعجز))** رواه مسلم، واتە: (بڕواداری بەهێز چاكترە وە لەلای خوا خۆشەویستترە لەهی بێهێز، بەڵام هەر كامێكیشیان هەر خێری تێدایە، ﴿مادام هەر ئیماندارە خێری تێدایە بەڵام وا باشە هەر بەهێز بێ، لە ڕووی عیلمییەوە لە ڕووی فیكرییەوە لە ڕووی ئیمانو تەقواو ئەخلاقو ئیدارییو سیاسییو لە هەموو ڕوویەكەوە هەوڵدە بەهێز بی﴾ ئینجا دەفەرموێ: سوور بە لەسەر شتێ كە سوودت پێ دەگەیەنێ، وە پشت بە خوا ببەستەو دەستە پاچە مەبە، ﴿ واتە دەست بە خۆدا بەر مەدەوەو بێ هێزو بێ توانا مەبە﴾ وە پێغەمبەر (علیه

الصلاة والسلام) لە دووعای زۆر مەشهووری خۆیدا دەیفەرموو: ((اللهم اني اعوذ بك من الهم والحزن، واعوذ بك من العجز والكسل، واعوذ بك من الجبن والبخل، وأعوذ بك من غلبة الدين و قهر الرجال)) متفق عليه، واتە: ئەی خوایە پەنات پێدەگرم لە خەمەتو پەژارە، وەپەنات پێدەگرم لە نەتوانینو تەنبەڵیی، وەپەنات پێدەگرم لە ترسنۆكییو ڕژدیی، وە پەنات پێدەگرم لە كەوتنە بن قەرزو ستەمو چەوساندنەوەی پیاوان.

پوختەی قسان: براو خوشكانی ئامادەبووانی كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی!

بەنسبەت راستی یە ئیمانییەكانەوە كورتەكەی ئەوەیە كە ئێمە تەماشای قورئان بكەینو قورئان بكەین بە تەرازوو، قورئان چەندەی پانتایی تەرخان كردوە بۆ هەر شتێك، لە قەدەر ئەو پانتاییە ئێمە گرنگی پێبدەین، قورئان لە چەند شوێندا باسی ئیمان دەكات، لە چەند

ئایەتدا باسی تەقوا دەکات، لە چەند شوێن باسی صەبرو یەقین دەکات، باسی عیبادەت دەکات، باسی ئەخلاقو ڕەوشتی بەرزو جوان دەکات، باسی پشت بە خوا بەستن دەکات، باسی باوەڕ بەخۆبوون دەکات، باسی ئامادەکردنی هێز دەکات، با تەماشای قورئان بکەین، قورئان پێوەرو تەرازوویە، بە ئەندازەی گرنگیدانی قورئان، با ئێمەش گرنگی بە شتەکان بدەین، وە بە ئەندازەی ئەوە کە قورئان کەمتر بایەخی پێداون با ئێمەش کەمتر بیانخەینە ئەولەویەتی کارمانەوە، ئاوا بەم شێوەیە موسڵمانی ڕاستو دروست، کۆمەڵێکی ڕاستو دروستو هاوسەنگ دەردەچین.

ئێمە زۆر جار لە ئەنجامی ئەوەی کە لە ڕووحی قورئان دوردەکەوینەوە، شتێك کە قورئان لەوانەیە هەر باسی نەکردبێ، یاخود زۆر بە لاوەکیی باسی کردوە، تەماشا دەکەی زۆر لە خۆمانمان گەورە کردوە، بەڵام شتێك کە قورئان پانتاییەکی زۆری بۆ تەرخان کردوە، ئێمە بایەخی

كەممان پێداوە، یان هەر فەرامۆشمان كردوە، بەعزە گوناهێكی گچكە هەیە لە نێوان موسڵماناندا وەكو شتێكی زۆر گەورە دادەنرێت، كەچی بەعزە گوناهێكی زۆر گەورە هەیە، وەكو غەیبەتو درۆو بوختان، بە شتێكی بچووك دادەنرێ، نا، دەبێ تەرازووی ئێمە بۆ هەڵسەنگاندنی چاكەو خراپەكان قورئان بێت، خوا (سبحانەو تعالى) دەفەرموێت: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ...﴿١١٥﴾ الأنعام﴾، واتە: فەرمایشتی پەروەدگارت تەواوی كردوە، لە ڕاستیی داو لە دادگەرییدا.

هەروەها خوا (سبحانەو تعالى) دەفەرموێت: ﴿ اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ ...﴿١٧﴾ الشورى﴾، ئەو خوایەی كە كتێبی ناردوە، بە حەق، وە تەرازووشی ناردۆتە خوار.

## تەوەرەی دووەم

## تەوەری سیاسی: لەژێر ناوونیشانی:

## (ئەرکی سەرشانمان و هەڵوێستو هێڵە گشتی یەکانمان) دا

بەڕێزان!

ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی ئەگەر تەماشای ڕابردووی خۆمان بكەین، وەكو لەو فیلمە دیكۆمێنتارییەشدا بینیمان –دەستیان خۆش بێت– بەراستی قۆناغی زۆرمان بڕیون، هەڵەتو هەڵدێرو هەورازو نشێوو گرفتاری زۆرمان هاتوونە پێش، بەڵام پێم وایە، – بە پشتیوانی خوا، پاشان بە هەوڵو هیممەتی هەموو لایەك، برایانو خوشكان، پیرو گەنج، هەموو لایەك، وە بە هاوكاری جەماوەری مسوڵمانمان–، بەڕاستی سەربەرزانە لێیان

دەرچووین، جا من پێم وایە كە بۆ ئەم قۆناغەی ئێستامان، لە رووی سیاسیەوە ئەركی سەر شانو هەڵوێستو هێڵە گشتیەكانمان، پێویستە بەم شێوەیە بن:

## یەكەم: لەسەر ئاستی هەرێمی كوردستان:

یەك/ خزمەتی خەڵكو كۆمەڵگەكەمان، وە پارێزگاریی لێكردنی ولاتو نیشتمانمان ئەركێكی شەرعییە، چونكە ئێمە كە باسی دین دەكەینو باسی دینداریی دەكەین، فامكاڵو ناحاڵیی وا هەیە وا دەزانێ كە ئێمە هیچ پەوەندییمان بە خەڵكو ولاتو نیشتمانو میللەتەوە نیە، نازانێ كە ئەو دینە بۆ ئەو خەڵكە هاتوە، دین بۆ ژین هاتوە، خوا پێغەمبەرانی ناردوە (علیهم الصلاة والسلام) خەڵك بەختەوەر بكەنو دادگەریی لەنێو خەڵكدا بچەسپێنن.

بەڵێ ئێمە خزمەتی خەڵكو ولاتو نیشتمانی خۆمان بە ئەركێكی شەرعی دەزانین، وە بە خاڵێكی

هاوبەشیشی دەزانین لە نێوانی خۆمانو سەرجەم لایەنو پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا، چونکە ئێمە بەبێ کۆمەڵگا بوونمان نابێ، وە بەبێ وڵات ژینمان نابێ، لەنێو خەڵکدا نەبی، تۆ لەکوێ دەبی؟ لەسەر نیشتمان نەبی چۆن دەژی؟ کەواتە: هەموو ئەوانەی موزایەدەی نەتەوە پەروەریی‌و نیشتمان پەروەریی بەسەر ئێمەوە دەکەن، حاڵی نەبوونو نازانن کە ئێمە خۆشویستنی وڵاتو خەڵکو میللەتمان بە بەشێك لە دینداریی‌و تاعەتێك کە بۆ خوا ئەنجامی دەدەین دەزانین، ئەوانەش کە بە بیانووی ئەوەوە ئێمە بۆ سروودی (ئەی ڕەقیب) هەڵنەساینەوەو بۆ سرووی نەتەوەیی لە بەغداد هەڵساینەوە[٢]، ئەوەیان کردە دەستەچیلەی شەڕ پێ فرۆشتن‌و گێچەڵ پێکردنێکی

٢) کە وەك چەند جارێك ڕوونمان کردۆتەوە، هۆکارەکەی ئەوەیە کە سرووده بەناو نیشتیمانییەکەی (ئەی ڕەقیب) شتی پێچەوانەی عەقیدەی تێدایە، بەڵام ئەوەی عێراق وانیە.

بێ مەعنا، ئەوەندە دەڵێین کە ئایا بۆ ئینسان نیشتمان پەروەرێتییەکەیو نەتەوە پەروەرییەکەی بەس نیە، بەس نیە کە ئامادە بێت خزمەت بە گەلی بکات، ئامادە بێ خزمەت بەنیشتیمانی بکات، ئامادە بێ دیفاعیان لێ بکات، خۆی لەسەریان بە کوشت بدات، ئایا ئەوەندە بەس نیە؟ حەتمەن دەبێ هەر بیانپەرستێ؟! من دەڵێم: هەر کەسێ نیشتمان پەرست بێو هەر شتێکی دی پەرست بێ، لە راستیدا متمانە بە هیچ شتێکی ناکرێ، بەڵکو متمانە بە مرۆڤی خواپەرست دەکرێ، هەر ئیمانو عەقیدەی مەعنەوییو رەبتو پەیوەست بوون لەگەڵ خوادا خەسڵەتە پەسندەکان (فضائل) لە ئینساندا دروست دەکات.

زۆرمان بینین ئەوانەی کە دەڵێن: دینمان...ئاینمان هەر نیشتمان... نیشتمانو وڵاتەکەیو میللەتەکەشی هەرزان فرۆش کرد، بەڵام ئیمانو عەقیدەی دینی، خواپەرستیو موسڵمانەتی، وا لە موسڵمان دەکا لە

ترسی خوا نەتوانێ زوڵم لە میللەتەكەی بكا، نەتوانێ هەرزان فرۆشی بكا، نەتوانێ خیانەتی پێ بكا.

ئێمە ئەگەر نەتەوە پەروەرێتیو نیشتمان پەروەرێتی مەرج بێ(٣)، حەتمەن دەبێ نەتەوەو نیشتمانەكەمان بكەینە بتو صەنەم، ئەوە لە لامان ڕەفزە، چونكە ئێمە خوا پەرستین، خاكو خەڵك پەرست نین، بەڵام ئێمە نیشتمانی خۆمان خۆشدەوێ، میللەتی خۆمانمان خۆشدەوێ، وە كردەوەو پەرێزیشمان بەڵگەو شایەدە.

دوو/ یەكڕیزییو هاوكارییو برایەتیی لەگەڵ لایەنو تەوژمو كەسایەتییە ئیسلامییەكاندا: لایەنە ئیسلامییەكان، تەوژمە ئیسلامییەكان، كەسایەتییە ئیسلامییەكان، ئێمە بە پێویستی دەزانین، كە لەگەڵیاندا هاوكارو

---

٣) كە لە ڕاستیدا ئەمە وانییە، مەگەر لای ناسیۆنالیستو نەتەوەپەرستو شۆڤێنیستەكان.

دەستبارگــر بیــن چــونکە خــوا (ســبحانەو تعالــی) دەفـەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٌ ...﴾ الحجرات ١٠، وە دەفـــــەرموێت: ﴿...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ ...﴾ المائدة ٢.

سێ/ لەگەڵ لایەنە سیاسییەکاندا:

١- هاوکاری لە کارو ئامانجی هاوبەشدا، وەك تا ئێستا کردوومانـــە، وەك پاراســتن‌و دابینکردنـــی مافـــە ڕەواکانی گەلەکەمان.

جا هـەر کەسـە بەهانـدەرێك دەیکـات، مـن وەکـو دینـداریی‌و مـسوڵمانێتی لەسـەر خـۆمی بـە فـەرز دەزانم دیفاع لە میللەتی خۆم بکەم، کە میللـەتێکی بـەش خـوراوە، میللـەتێکی بێبەشـە، میللـەتێکی سـتەمدیدەیە، وە کـە دیفـاع لـە وڵاتەکـەم بکـەم، لەسەر خۆمی بـە فـەرزێکی شـەرعیی دەزانم، هـەر

كەسێكیش كە بە هاندەرێكی دیكە دەیكات، گرنگ ئەوەیە لەو خاڵەدا پێكدەگەینەوە.

٢- ئێمە هەوڵ دەدەین بەشێ بین لە چارەسەری كێشەی كورد لە وڵاتانی دەوروبەرو دراوسێماندا، نەك بەشێكبین لە گرفت، ئەمەش بەوە دەبێت هەم لە نێوخۆماندا خیتابی سیاسیو نەتەوەییمان یەك بخەین، هەم لەگەڵ لایەنە سیاسییەكانی بەشەكانی دیكەی كوردستاندا پێكەوە دابنیشین، لێك حاڵی بین، ناكرێ هەندێك لایەنی سیاسی ئێمە ئیحراج بكەن لێرە، ئێمە سەغڵەت بكەن، وە ناشكرێ ئێمەش بێ هەڵوێست بین، بەڵام دەبێ لەسەر بناغەی ڕاوێژ، لێكحاڵی بوون، پێكەوە تەفاهوم كردن، دیفاع لە مەزڵومییەتی خۆمان بكەین، وە كارێكی واش نەكەین كە بەرامبەرەكانمان بیانوو پاساویان بكەوێتە دەست.

چوار/ لەگەڵ پەرلەمان و حکومەتدا:

١- جەختکردنەوەو کارکردن بۆ هەرچی زیاتر سەربەخۆبوون و کارابوونی پەرلەمان و حکوومەت، وە دوورخستنەوەی دەستتێوەردانی حزبیی، وەکو تا ئێستاش زۆر بە تۆخیی بەردەوامە.

٢- بە نسبەت پەرلەمانتارەکانمان، بەردەوامبوون لەسەر ئۆپۆزسیۆن بوونێکی سەنگین و هاوسەنگ، کە ئەوە قسەو پێناسەی خەڵکی دیکەیە بۆ پەرلەمانتارانی ئێمە، چ لە خولی پێشوو، چ لەم خولەدا، پەرلەمانتارەکانی کۆمەڵ، سەنگین و هاوسەنگن، بەردەوامبوون لەسەر ئەو حاڵەتەو لێزیادکردنی.

٣- هەوڵدان بۆ هەرچی زیاتر وادارکردنی بەرپرسانی قەوارە سیاسییەکەمان، بۆ چەسپاندنی دادگەریی و ڕیشەکێشکردنی گەندەڵیی، چونکە ئێمە بە عەدالەت

وڵاتمان بۆ فـراوان دەبێـت، بـەڵام بـە زوڵـمو سـتەم ماڵی خۆشمان لـێ تەنگ دەبێت، عەلی كوڕی ئەبی تالیب خوای لـێ ڕازیبێت چەند جوان دەفـەرموێت: (ومن ضاق بـه العَدْلُ فـالجَوْرُ عليـه أضـيق)، واتـە: هەر كەسێك دادگەریی لـێ وەتـەنگبێ، ئـەوا زوڵـمو ستەم زیاتر لێی وە تەنگ دێ.

بەڵێ ئێمە بە عەدالـەت دەتـوانین پێكـەوە بـژین، بـەڵام بـەزوڵمو سـتەمو چـینایەتیو قڕیـیو پڕیـیو گەندەڵییو پۆخەڵیی هەموومان زیانبارین.

٤- سـەبارەت بــە چــۆنییەتی مامەڵــەمان لەگــەڵ حكوومەتو پەرلەماندا ئەركمان، ئەوەیـە كـە ئێمـە هاندەرین بۆ هەموو لایەك، كە چاوێكی جیددیی بە ژیانو گوزەرانی خەڵكیدا بگێڕێتـەوەو، چـی دیكـە سەروەتو سامانی ئەم وڵاتە بە هەردەر نـەدرێتو، چی دیكە بـۆ بەرژەوەنـدی حیزبیـیو بەرژەوەنـدی

تاکیی بەکارنەهێنرێت، ئێمە سەروەت و سامانێکی باشمان دێتە دەست، چ ئەوەی وەکو بودجە لە بەغداوە دێت، وە چ ئەوەی لە وڵاتی خۆمان وەك گومرگ، وەك فرۆشتنی سووتەمەنیی، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا وەکو پێویست خەڵك لێی بەهرەمەند نەبووە، بە تایبەتی خەڵکی ئاتاج و موحتاجی بەناو ئەنفالکراو کیمیایی لێدراوو خەڵکی پەککەوتەو بێ دەرەتان.

چونکە ئێمە ئەگەر بمانەوێ خوا لە خۆمان رازی بکەین، وە بمانەوێ خەڵکەکەمان دڵی بە وڵاتمان خۆشبێت، دڵی بە هەموو لایەکمان خۆشبێ، پێویستە چاوێکی جیددیی بەو لایەنەی ژیان و گوزەرانەی خەڵکیدا بگێڕینەوە کە دیارە ئەوەش ئەرکی سەرشانەوە نەبێ خێر پێکردن و چاکەکردن بێت لەگەڵ خەڵك، بەڵکو ئەرکی سەرشانە، ئەگەر نەیکەین لەسەری گوناهبارین و عەیبدارین.

## دووەم: لەسەر ئاستی عێراق:

یەك: ئێمە لەگەڵ پێکهێنانی حکوومەتێکی هاوبەشی بنکە فراوانین، کە هیچ لایەکی تێدا پەراوێز نەخرێت.

دوو: هیوادارین هێزەکانی ئەمریکا لە کاتی خۆیدا عێراق بەجێبهێڵن، وە ئەو کابووسی داگیرکاریی‌و ئیحتیلالە لەسەر سینگی خەڵکی عێراق لاچێت، کە بەداخەوە کوشت‌و کوشتارو شەڕی نێوخۆیی‌و تائیفی‌و ماڵوێرانییەکی زۆری بۆ خەڵکی عێراق هێنا، هەرچەندە ملۆزمێکی وەکو رژێمێکی بەعسیشی لە کۆڵکردینەوە، کە ئەوە بەڕاستی چاکەیەك بوو، بەڵام دیارە فەسادو خراپەو ماڵوێرانیی‌و گیرو گرفتی زۆریشی لەگەڵ خۆیدا هێنا، کە ئەگەر ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی یارمەتی خەڵکی عێراقیان دابا، ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، دەیتوانی ئەو ڕژێمە بڕووخێنێ‌و ئەو هەموو دەرهاویشتە خراپانەش پەیدا

نەدەبوون، کە هەم بۆ خەڵکی ئەمریکاو، هەم بۆ خەڵکی عێراقیش زۆر بە قورسی تەواو بوون.

سێ: ئێمە داکۆکیی دەکەین لەسەر هەرچی زووتر دوای پێکهاتنی ئەم حکوومەتەی ئەمجارە، حکوومەتی فیدراڵی عێراق، بە زوویی ماددەی (١٤٠) جێبەجێ بکرێت، وە ناوچە دابڕاوەکان، لە پێش هەموویانەوە کەرکووک، بگێڕدرێنەوە سەر هەرێمی کوردستان.

چوار: ئێمە دەمانەوێت فاکتەرو هۆکارێک بین بۆ نەهێشتنی شەڕی مەزهەبیی و نەتەوەیی و چەوساندنەوەی سیاسیی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ، کە هەموو ئەوانە بەداخەوە لە عێراقدا هەن، جا لە شوێنێک کەمترو لە شوێنێك زیاتر، وە ئێمە داکۆکیی دەکەین لەسەر:

١- گەڕانەوە بۆ ناسنامەی مسوڵمانێتی، لە جیاتی ناسنامەی مەزهەبیی و تائیفیی، چونکە خوای زانا

دەفــەرموێت: ﴿... هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا ... ﴿٧٨﴾ الحج﴾، واتــە: خـوا ئـەو كەسـەیە كــە لەمەوبــەرو لـــەم قورئانەشـــدا نـــاوی لێنـــاون مسوڵمان، خۆمان ناومـان لـە خۆمـان نـاوە شـیعەو سـوننەو فـڵان مەزهـەبو فـڵان تائیفـە، بـەڵام خـوا ناوی لـێ ناوین مسوڵمان، بـا ئـەو نـاوەی خـوا لێـی ناوین بگەڕێینەوە بۆ ئەو ناوە، كـە بـە تەئكیـد زۆر لــە كێــشەكان، لــە مەزهــەبو تائیفەكانــەوەو لــە دەرمارگیریی تائیفیی‌و حیزبیی مەزهەبییەوە پـەیدا دەبن، نەك لە خودی دینداریی‌و مسوڵمانێتی، وە بە تەئكیـد مــسوڵمانێتی، ئەگــەر بــە تێگەیــشتنێكی قووڵ‌و فراوانەوە بێت، نەك هیچ گرفتێكی لـێ پـەیدا نابێت، بەڵكو سـەراپا خێـرو خۆشـییەو بەرەكـەت‌و ڕەحمەتە.

٢- گەڕانەوە بۆ تەبایی‌و پێکەوەژیانی نەتەوەیی لە جیاتی دەمارگیریی، دەبێ عەرەب لە عێراقدا ئەوە لە کەللەی خۆیان بەرنەدەر کە کورد هاووڵاتی پلە دووو سێیە، هەروەها کوردیش عەرەبی ئێستاو مامەڵەی عەرەبی ئێستا، ئەگەر مامەڵەیەکی باشبوو، قیاس نەکەنە سەر مامەڵەی عەرەبە رەگەزپەرست‌و شۆڤێنییە بەعسییەکان، کە خوا لە کۆڵێ هەموو لایەکمانی کردنەوە.

٣- گەڕانەوە بۆ رێزگرتن لە مرۆڤ وەکو مرۆڤ، بەبێ رەچاوکردنی هیچ ئیعتیبارێکی دیکە، چونکە خوای کاربەجێ دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ...﴿٧٠﴾ الإسراء﴾، واتە بەڕاستی رێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە.

## سێیەم: لەسەر ئاستی وڵاتانی دەورووبەر:

یەك: ئێمە بە پێویستی دەزانین سوپاسی وڵاتانی دەوروبەرمان بکەین، وڵاتانی دراوسێ، لەسەر هاوکاریی و هەڵوێستی ئیجابییان، کە لە زۆر شتدا بەرجەستە دەبێت، بەتایبەت کردنەوە کونسوڵخانەکان، وە ئەو بازرگانیی و مامەڵەو پەیوەندییانەی کە هەن، کە کەم و زۆر خەڵك لێی بەهرەمەندە، هەرچەندە تا ئێستا زیاتر بەهرەو سوودی حیزبیی لێوەرگیراوە.

دوو: پەیوەندیمان لەگەڵیان لەسەر بناغەی ڕێزی دووسەرەو بەرژەوەندی هاوبەش، وە هەڵوێستی ئیجابییان لەگەڵ خەڵکی هەرێمی کوردستان و لە عێراقدا بنیاد دەنێین.

سێ: جەختدەکەینەوە لەسەر پاراستنی هێمنیی و ئاسایشی هەرێمی کوردستان و عێراق و وە هێمنیی و ئاسایشی وڵاتانی دراوسێشمان، چونکە بەڕاستی ئێمە ناتوانین لە هەرێمی کوردستان و لە عێراقدا بارودۆخێکی هێمن و

ئاسایشمان هەبێت، ئەگەر لە توركیاو لە ئێران‌و لە سوریاو لە دەوروبەرمان ئاشووب‌و ئاژاوە هەبێت، بۆیە پێویستە هەموولایەك سووربین لەسەربەرقەراركردنی هێمنی‌و ئاسایش لە هەموو شوێنەكاندا.

## چوارەم: لەسەر ئاستیی جیهانی ئیسلامیی:

یەك: ئێمە پشتیوانی خۆمان بۆ كێشەی هەموومسوڵمانانی ستەمدیدەو مەزڵووم دووپات دەكەینەوە، لە هەر گۆشەو كەنارێكی دونیادا بن، بە تایبەت مسوڵمانانی مەزڵووم‌و ستەمدیدەی فەلەستین، كە بە تایبەت لەم دواییەدا رژێمی زایۆنی بە دەست لە پشتدانی زلهێزان، بەتایبەت ئەمریكا، یەكجاریی شوولی لێ هەڵكێشاوە، بە تایبەت بەرانبەر مسوڵمانانی كەرتی غەززە.

دوو: هیواداریین كە وڵاتانی ئیسلامیی رۆڵی خۆیان لە پشتگیریی‌و هاوكاریكردنی خەڵكی عێراق بە گشتیی‌و بەتایبەت هەرێمی كوردستاندا ببینن.

سێ: پێویستە ئێمەی مسوڵمانان لەسەر ئاستی دەوڵەتو ڕێکخراوەکانی مەدەنیو سیاسییەکانو زاناو بیرمەندانیان کاری جیددیی بکەین، بۆ بووژاندنەوەی برایەتیو ئیمانییو ئیسلامییمانو چی دیکە لەو قاوغو قەپێلکە بچووکانەی کە دوای پەیمانی (سایکس بیکۆ) ئێمەیان تێخزاندوە، چی دیکە خۆمان نەخنکێنین، تەماشا دەکەین وڵاتانی ئەورووپا، یەکیەتی ئەورووپا پێکدەهێنن، ئەمریکا پەنجاو یەك ویلایەتە، بەڵام بەداخەوە کە جیهانی ئیسلامیی وەکو گۆشتی خێرێ بەخشراوەتەوە، وە مسوڵمانان خراونەتە قاوغو قەپێلکی بچووك بچووکەوە، کە زۆر جار ئەو سنوورە دەستکردانە لە مسوڵمانان کراون بە شتی پیرۆز (مُقَدَّس)، نازانن کە لە ئەساسدا لەسەر بناغەی پەیمانی شوومی (سایکس بیکۆ) هاتوونەتە دی، کە لە ساڵی (١٩١٦)ز دا کە لە نێوان رووسیاو بەریتانیاو فەرەنسادا مۆرکراوە.

## پێنجەم: لەسەر ئاستی وڵاتانی جیهان:

یەك: ئێمە بە یەك چاو تەماشای وڵاتانی دونیا ناکەین، ئەمریکا حیسابێکی هەیە، رووسیا حیسابێکی هەیە، فەرەنسا، بەریتانیا، هەرکام لەوانە حیسابێکیان هەیە، چونکە ئێمە پێویستە بە ئینساف بین لە حوکمداندا، وە پاشان تەماشاکردنی رژێمو حکوومەتەکان، جیا لە تەماشاکردنی میللەتان، ئێمە هیچ گرفتێکیان لەگەڵ میللەتانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوادا نیە، میللەتان هەموویان دەچنەوە سەر ئادەمو حەواو، ئێمە گرفتمان لە گەڵ ئەو زوڵمو ستەمەدایە، کە گەلێك جار رژێمەکان تەبەننی دەکەن.

دوو: هیوادارین کە دەوڵەتان بە تایبەت ئەو زلهێزانەی کە زیاتر بڕیار بەدەستن، چیدیکە مافەکانی مرۆڤ پێشێل نەکەن، وە چی دیکە ئەو شیعارانەی کە بەرزی دەکەنەوە هەر ناوی بێ نێوەڕۆك نەبن،

میللەتێکی مەزڵوومی وەکو میللەتی کورد، کە چل پەنجا میلۆنە، چی دیکە لە حاڵێکدا کە لە جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤدا هاتوە، وە لە پێش ئەوەدا لە دوایین بەرنامەو کتێبی ئاینی خوادا هاتوە کە میللەتان هەموویان خوا کردوونی بە میللەت وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿...وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ ...﴿١٣﴾ الحجرات﴾ چی دیکە ئێمە لە مافە سەرەتاییەکانمان بێبەش نەکرێین، ئەوان ئەگەر ڕاستدەکەن لەگەڵ شیعارەکانی خۆیاندا، با هاوکارمان بن و دەستبارگرمان بن، ئەگەر قەوارەی سیاسیشمان بۆ دروست ناکەن، لانیکەم ئەو زوڵم و ستەمانەی کە لە سەرمانن هاوکارمان بن کە لەسەرمان لاچن.

## تەوەرەی سێیەم:

## چەند هەڵوەستەیەکی فیکریی

براو خوشکانی بەڕێز!

بە پێویستی دەزانم کە چەند هەڵوێستەیەکی فیکریی لە بەرامبەر چەند مەسەلەیەك گرنگو هەستیاردا بکەین، کە ناگونجێ ئێمە وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی لە کۆنگرەیەکی ئاوادا قسەیان لێ نەکەین:

**مەسەلەی یەکەم: کاری ئیسلامییو تازەکردنەوەی ئایین:**

زۆرکەس نیشانەی پرسیار دەخاتە سەر کاری ئیسلامیی، سەر لایەنە ئیسلامییەکان بۆچی هەن؟ لە راستیدا کاری ئیسلامیی، بریتیە لە هەوڵدان بۆ لە خۆدا

بەرجەستەکردنی ئیسلام، وە بووژاندنەوەی دینداریی‌و پابەندیی بە ئایینەوە، لەسەر ئاستی تاک‌و خێزان‌و کۆمەڵ‌و دەوڵەت، ئێمە کاری ئیسلامییمان بە هاندەرو پاڵنەری خوا لە خۆی ڕازیکردن‌و دینداریی کردن ئەنجام دەدەین، نەك وەك ناحەزانمان هەمیشە وامان وێنا دەکەن کە ئەوە بۆ کورسی‌و پایەو مەقام هەوڵ دەدەن، ئێمە دەڵێین: بێ منەتیان دەکەین با بێن ئەو بەرنامەیەی ئێمە کە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)و ئایینی گەل مسوڵمانەکەشمانە، بابێن پیادەی بکەن، ئێمە سەرباز دەبین لە بەردەستیاندا وەکو زۆر جاری دیکەش گوتوومانە، بەڕاستی ئێمە نامانەوێت خۆمان بچینە سەر کورسی، دەمانەوێت دینەکەمان، شەریعەتەکەمان، ئەو شەریعەتەی کە خوا ناردوویەتی بۆ بەختەوەریی بەشەر، ئەوە لەسەر کورسی بێ، وەهەر کەسێ پیادەی بکا، ئێمە لە گەڵیدا دەبین، وە ئەوەش شتێك نیە ئێمە ئیختیارمان تێیدا هەبێت، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن

﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾ آل عمران، واتە: ئێوە کۆمەڵێك بن، یان لەنێو ئێوەدا با کۆمەڵێك هەبێ (ئەی مسوڵمانینە)، بانگەوازیکەن بۆ چاکەو فەرمان بە شتە پەسەندەکان بکەن و ڕێگریی لەشتە ناپەسندەکان بکەن، هەر ئەوانەش سەرفرازن، پێغەمبەریش (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((**لا تزال طائفة من أمتي قائمة بأمر الله، لايضرُّهم من خذلهم ولا من خالفهم، حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون على الناس**))، رواه البخاري.

پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام) لەم فەرموودەیەدا موژدەمان پێدەدا، کە ئێمە ئومێدمان وایە، ئێمە وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی و سەرجەم تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکانی عالەمی ئیسلامیی، لە چوارچێوەی ئەو موژدەیەی پێغەمبەردا بین، کە دەفەرموێ: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتی من فەرمانی خوا بەڕێوەدەبەن، نە ئەوانەی پشتیان بەردەدەن و نە ئەوانەش کە دژایەتییان

دەکەن زیانیان پێ ناگەیەنن، هەتا فەرمانی خوا دێ، (واتە: تا دنیا کۆتایی پێ دێ)، وە ئەوانە هەر زاڵن بەسەر خەڵکەوە، (ئەگەر بە هێز زاڵنین، بە بەڵگە زاڵن).

کەواتە: ڕاستە مسوڵمانان لە بەرانبەر مشوور لێخوران‌و بەتەنگەوەبوونی دین‌و ژینی کۆمەڵگاو مافی سەرپشك بوون‌و هەڵبژاردنیان نیە، بەڵکو لەسەریان پێویستە وەك ئەرکێکی گەورەی سەرشانیان پێی هەڵسن، وەك: نوێژو ڕۆژووو سەرجەم ئەرکەکانی دیکەی سەرشانیان.

**مەسەلەی دووەم: کۆششکردن‌و شوێنەکەوتنی سەلەفی سالح، دوو دیوی حەقیقەتێکن:**

هەندێ کەس دەیانەوێ وا مسوڵمانان حاڵی بکەن کە ئەگەر بە دوای پێشینەی چاك کەوتی، نابێ عەقڵت بەکاربهێنی، وە هەرکەسێك عەقڵی خۆی بەکارهێنا، بۆ بیرکردنەوەو تێگەیشتنی هاوچەرخانە لە قورئان‌و سوننەت، ئەوە لە ڕێبازی سەلەفی سالح لایداوە!! بەڵام

لە ڕاستیدا وانیە، شوێنکەوتنی پێشینی چاکمان، لەگەڵ بەکارهێنانی عەقڵی خۆمانو ئیجتیهادکردنمان بۆ دەرهێنانی وەڵامو چارەسەری گرفتو کێشەکانمان لە قورئانو سوننەت، دوو دیوی یەك هەقیقەتن، وەك خوا (عز وجل) دەفەرموێ: ﴿... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ النحل﴾، واتە: زیکرمان بۆ تۆ ناردۆتە خوار تاکو ئەوەی کە بۆیان نێردراوە، بۆیان روون بکەیتەوەو بۆئەوەی خۆشیان بیر بکەنەوە، کەواتە: روونکردنەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەدیل نیە بۆ بەکارهێنانی عەقڵی خۆمان، خۆشمان دەبێ بیربکەینەوە، ئایا ئەو هەموو پێشەوایانەی ئێمە ئیجتیهادیان نەکردوە؟ ئایا بیریان نەکردۆتەوە؟!

ئنجا بۆچی سەلەفی ساڵحی ئێمە پێویستە شوێن پێیان هەڵگرین، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: **((خير الناس قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم))** متفق علیه، واتە: باشترین خەڵك ئەوانەن کە

لەسەردەمی مندان، ئنجا ئەوانەی دوای وان، ئنجا ئەوانەی دوای وان، بۆچی؟ چونکە بەڕاستی ئەوان عەقڵی خۆیان بەتەواویی بەکاردەهێنا بۆ تێگەیشتنی دین، وە هەرکەسێك عەقڵی خۆی چاك بەکارنەهێنێ، دینەکەی بۆ ناکرێتە کاڵای باڵای ژین‌و دینەکەی بۆ دانابەزێنرێتە سەر واقیعی ژین.

**مەسەلەی سێیەم: تەبایی‌و پێکەوە ژیان:**

**(تەبایی‌و پێکەوە ژیان) بەرهەمی سەلماندنی بوونی یەکدی‌و تەحەممول کردنی جیاوازییەکانە:**

ئەمە چ لەسەر ئاستی کۆمەڵێکی وەکو کۆمەڵی ئیسلامیی، چ لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیی، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگاکەمان بە گشتی، ئێمە دەبێ بوونی یەکدی بسەلمێنین، بوونی یەکدی واتە بە ڕای جیاوازەوە، بەتایبەتمەندی جیاوازەوە، ئنجا کە بوونی یەکدیمان سەلماند، پێکەوەش تەبا دەبین‌و یەکدی تەحەممول دەکەین.

ئایەتەکانی قورئان، نەك لەسەر ئاستی لایەنێکی ئیسلامیی، بیروڕاو ئیجتیهادی جیاواز ڕێگا پێ دەدەن، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو بەشەر خوا (سبحانەو تعالی) هەواڵمان پێ دەدا کە خوا نەیویستوە خەڵکی بکاتە یەك شێوە ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ یونس﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای تێکڕای خەڵکی سەر زەوی ئیمانیان دێنا، ئایا تۆ تۆبزییان لێ دەکەی تاکو بیانکەیە ئیماندار؟! واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تۆ ئەوەت بۆ نیە، ئنجا دیارە ئەگەر بۆمان نەبێ کافرێك بەزۆر مسوڵمان بکەین، بە تەئکید باشتر بۆمان نیە موسڵمانێك بەزۆر لە بیرو ڕایەك کە قەناعەتی پێیەتی دابەزێنین، بۆ قەناعەتی خۆمان، ئەدی چارەمان چییە؟ دەبێ ڕێز لە یەکدی بگرین و یەکدی تەحەممول بکەین وە پێکەوە تەبا بین.

**مەسەلەی چوارەم: کاری سیاسییو بانگەواز دوو شتی جیاواز نین، بەڵکو هۆکارو ئامانجن:**

جار جار ئەم مەسەلەیە دەورووژێنرێ، ئەوەی کاری سیاسیی بکات نابێ بانگەواز بکاتو، ئەوەی کاری بانگەواز بکا نابێ کاری سیاسیی بکا.

ئێمە دەڵێین: کاری سیاسیی وەسیلەیە، بەڵام بانگەواز ئامانجە، هەموو پێغەمبەران هاتوون (علیهم الصلاة والسلام) خەڵك بەرەو خوا بەرنو، خەڵك لە خوا نزیك بخەنەوە.

ئێمە کە کاری سیاسیی دەکەین، بەڵکو لە کاتی خۆیدا کە کاری جەنگو جیهادیش کە دەکەین، هەمووی بۆ ئەوەیە خەڵك لە خوا نزیك بێتەوە، خەڵك بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار بکات، کەواتە ئەو دوو شتانە تێك گیراو نینو بەدیلی یەکدیش نین بەڵکو هۆکارو ئامانجن.

**مەسەلەی پێنجەم: لەبارەی ڕاوێژ دیموكراسییەوە، زۆر جار خەڵكی ئیسلامیی ئێمە هەیە دیموكڕاسیی بە هەموو شتێكەوە ڕەفز دەكات و هەشە بە كوڵك و پێستەوە قبوڵی دەكات.**

حەقیقەت بە بۆچوونی بەندە ئەوەیە كە دیموكڕاسیی و ڕاوێژ (شوری) خاڵی هاوبەشیان هەیە، خاڵی جیاوازییشیان هەن و، خاڵی هاوبەشیشیان هەن، خاڵە هاوبەشكانیان:

١- هەردووكیان شێوازو میكانیزمی حوكمڕانیین، دیموكراسیی بەرنامە نیە، شێوازی حوكمڕانییە، شووڕاش بە هەمان شێوە ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ الشورى﴾.

٢- لە دیموكڕاسیی و شووڕادا خەڵك سەرچاوەی دەسەڵاتە، بڕیار بەدەست خەڵكە.

٣- زۆرینە حوكم دەكات بەسەر كەمینەدا.

٤- یەكسانیی، دادگەریی، ئازادیی بیروڕا چەند مەبدەئێكن هەردوولا لەسەریان كۆكن.

٥- مەرجەكانی ئەندامی پەرلەمان لەگەڵ مەرجەكانی ئەندامی ئەنجوومەنی شووڕا، لێك نزیكن تا ڕاددەیەكی زۆر، ئەمانە خاڵە هاوبەشەكانن.

بەڵام خاڵی لێك جیاشیان هەن:

١- ڕاوێژ (شورا) لە كەش و هەوای دینداریدا دروست بووە، بەڵام دیموكراسیی لە كەش و هەوای بێدینییدا پەیدا بووە لە ڕۆژئاوا، بۆیە هەندێ كەس كە باسی ڕاوێژو مەشوەرەتت كرد، یەكسەر هەندێ شتی كە لە مێژووی ئیسلامدا هەبووە تەداعی دەكات بۆ مێشكی، لە حاڵێكدا كە ستەم و هەڵەیە، لادان و هەڵەو پەڵەی مسوڵمانان بخرێتە ئەستۆی ئیسلام و سیستەمە ڕاوێژییەكەیەوە، وە هەر كاتێكیش باسی دیموكراسیی كرا، هەندێك لە مسوڵمانان هەموو ئەو شتانەی كە لە ڕۆژئاوادا بووە، لە كوفرو عەلمانییەت تەداعی دەكات

بۆ نێو مێشکی، لە حاڵێکدا کە دەگونجێت دیموکراسیی جیا بێت لەو جەوە کوفرەی تێیدا پەیدا بووە.

٢- پاشان دیموکڕاسیی تایبەتە بە لایەنی حوکمڕانیی سیاسەتەوە، بەڵام شووڕا تەنها لایەنی حوکم ناگرێتەوە، بەڵکو لایەنی عیلمییو لایەنی فیکرییو خێزانییو کۆمەڵایەتیی... هتد، دەگرێتەوەو گشتگیرە.

٣- لە دیموکڕاسییدا مافی یاسادانان بە ڕەهایی بەدەست خەڵکە، خەڵك چی بڕیار دەدا دەبێتە یاسا، بەڵام لە سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامدا مسوڵمانان لە شتێکدا ڕاوێژ دەکەن کە شەریعەت دەقی لەسەری نەبێتو، شەریعەت قسەی لێ نەکردبێ، وەك گوتراوە: (لا اجتهاد في مقابل النص).

٤- دیموکراسیی گوێ بە ئەخلاق ناداو خەڵك چۆنی پێ خۆشبێ وا بڕیار دەدا، با ئەنجامی سەیرو عەجایبیشی لێبکەوێتەوە کە شایستەی ئەم مەجلیسە نیە باسی بکەین! بەڵام شووڕای ئیسلامیی پابەندە بە شەریعەتەوە.

٥- دیموكڕاسیی زەمینەی گەشە كردنی بۆ ڕەخسا، بەڵام بەداخەوە شووڕای ئیسلامیی كۆسپو بەربەستی زۆری هاتنە پێشو هەر لەو كاتەوە كە سیستەمی خیلافەتی ڕاشیدە گۆڕا بۆ پادشایەتی لە سەردەمی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیانەوە، شووڕا پەكی خرا، بەڵام پێویستە بزانرێ كە شووڕا بەس لەڕووی حوكمو سیاسەتەوە پەكی خرا، ئەگەر نا لە ڕووی ئیجتیهادو فیكرەوە هەر بەردەوام بوو.

لە كۆتایی بەراوردی نێوان ڕاوێژو دیموكڕاسیو هەڵسەنگاندنیاندا، دەڵێم:

ئەوانەی كە زۆر پشتگیریی دیموكڕاسیی دەكەن، سەرنجی دوو شتان دەدەن:

یەكەم: تەماشا دەكەن بەدیلی دیموكراسیی دیكتاتۆرییە، بۆیە دەڵێن: كەواتە دیموكڕاسیی هەر چۆنبێ بە هەموو شتێكەوە قبووڵمانە.

دووەم: دەڵێن: دیموكڕاسیی واتە حوكمی گەل، ئنجا مادام خەڵكو گەل موسڵمان بێ، كەواتە شتێ بڕیار نادا كە پێچەوانەی شەریعەتەكەی بێت.

وە ئەوانەش كە بە هەموو شێوەیەك دیموكڕاسیی ڕەفز دەكەن:

یەك/ تەماشای واقیعە مێژوویەكەی دەكەن.

دوو/ تەماشای ئەوە دەكەن كە بە ڕەهایی حوكم دەداتە دەست خەڵك. بەڵام وەكو گوتمان ئینصاف ئەوەیە كە ئێمە هەم خاڵە جیاوازەكان، هەم خاڵە هاوبەشەكانی نێوان دیموكڕاسیی و شوورا ببینین.

**مەسەلەی شەشەم: پەنابردنە بەرهێز:**

مەسەلەیەكی دی مەسەلەی پەنابردنە بەرهێزە لە قۆناغی بانگەوازو كاری ئیسلامیدا، بەبیانووی پیادەكردنی شەریعەتەوە، كە ئەوە بەدڵنیاییەوە پێچەوانەی ڕێبازو شێوازی كاری پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام).

چونكه ئەگەر تەماشای هەموو پێغەمبەران بكەین (علیهم الصلاة والسلام) هەر لە ئادەمەوە تا خاتەم، هیچ پێغەمبەرێك نابینی هەڕەشەی كردبێت لە قەومەكەی خۆی، هەڕەشەی كردبێت لە زلەزلان و كافرانی قەومەكەی خۆی، بەڵكو هەمیشە بەپێچەوانەوە، نەیارانی پێغەمبەران بوون، كە هەڕەشەیان كردوەو چاویان سوور كردۆتەوەو ئاگرو ئاسنیان بەكارهێناوە، وەك خوا (سبحانەو تعالى) لە سوورەتی ئیبراهیم دا دەفەرمویٚ:

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ... ﴿١٣﴾ إبراهيم﴾، واتە: ئەوانەی بێ بڕوابوون بە پێغەمبەرانی خۆیانیان گوت: لە نیشتمانی خۆمان دەرتان دەكەین، یاخود دەبێ بگەڕێنەوە سەر دینەكەمان!

بەڵێ ئەوە كافرەكانن كە هەڕەشە لە بڕواداران (پێغەمبەران و شوێنكەوتووانیان) دەكەن، یان لە وڵات

وەدەریان دەنێن، یان كافریان دەكەنەوە، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چی دەڵێن؟

دەڵێن: ﴿... وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ... ﴿١٢﴾ إبراهيم﴾، واتە: وە صەبر دەگرین هەرچەندە ئازارمان بدەن، ناڵێن دەتانكوژین، واتان لێدەكەین، بەڵكو دەڵێن: صەبر دەگرین. وە شوعەیب (علیه السلام) دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ...﴿٨٧﴾ الأعراف﴾، واتە: وە ئەگەر كۆمەڵێكتان بڕوایان بەوە هێنا كە پێی ڕەوانەكراوم‌و كۆمەڵێك بڕوایان نەهێنا، ئەوە ئارام بگرن هەتا خوا حوكممان لەنێواندا دەكات، واتە: با یەكدی تەحەممول بكەین، ئەو كاتە حەق‌و ناحەق لە مەیداندا ساغ دەبێتەوە، نەك وڵات لە یەكتر قەدەغە بكەین، كەواتە: با هەموو كەس بزانێ كە حەقیقەت بەو

شێوەیەیە، وە ئەوەی کە بەداخەوە بەهۆی هەڵەی هەندێك لە لایەنە ئیسلامییەکانەوە، وە بەهۆی لە پشت پەردەی ڕەش‌و بێ ئینصافیی سەیرکردنی خەڵکێکی ناحەز بە تەوژمی ئیسلامیی یەوە، لە مێشکی خەڵکێکدا جێگیر بووە کە ئیسلامییەکان پەنادەبەنە بەرهێز، بەر ئاگرو ئاسن‌وخۆسەپاندن، لەڕاستیدا پێچەوانەی ڕێبازو مەنهەجی پێغمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، ئایا ئەوەندە بەس نیە کە پێغەمبەری ئێمە دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراند، بێ‌ئەوەی خوێن لە لووتی کەسێك بێت؟! لەسەر بناغەی ئەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن: گرێبەستی کۆمەلایەتی (العقد الأجتماعي) لەسەر بناغەی ئەوەی کە ئەوس‌و خەزرەج هاتن پێغەمبەری خوایان کردە سەرۆك، بەیعەتیان پێدا، لەسەر ئەو بناغەیە دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراند، وەك لە سەرچاوەکانی سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە.

# تەوەرەی چوارەم و کۆتایی

## (باسی کۆنگرە)

### چۆنێتی کۆنگرە:

جارێ دەڵێم: کۆمەڵی ئیسلامی زادەو بەرهەمی فیداکاریی و تێکۆشان و خەم و خەبات و موعاناتی هەموو لایەکە، خوا لە هەموو لایەکی قبووڵ بکا.

بۆیە پێویستە زۆر بە هەستکردن بە بەرپرسیارێتی، بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر خوا (سبحانەو تعالی) وە لە بەرامبەر خەڵکیشدا، لەگەڵ ئەم کۆنگرەیەدا وە لەگەڵ هەر پرۆسەیەکی دیکەی خۆماندا مامەڵە بکەین.

جا من لەوبارەوە ئەم چەند ڕێنموونیی و پێشنیارەم هەیە:

١- ئامانج لە بەستنی کۆنگرە، چاو بەخۆدا گێڕانەوەی ڕابردوویە، وە نەخشە دانانە بۆ داهاتوو، بۆیە با زۆر واقیع بینانە چاو بە ڕابردووماندا بگێڕینەوە، وە با هیچ کەس دەستی لەسەر دڵی دانەنێ، ئایا دەبێ چی بگوترێو چۆن ڕەخنە بگیرێ؟! با ڕەخنە بگیـرێو با قسە بکرێ، وە با بە باخەڵ فەڕاحیی وەری بگرین، مەگەر ئێمە قەرارمان نەداوە هەڵەوگوناهمان هەیە؟ وە قەرارمان نەداوە کە کرچو کاڵییمان هەیە؟ وە قەرارمان نەداوە کە هیچ کەس لە سەروو ڕەخنەوە نیە؟

کەواتە: ئەو ئامانجەی کە کۆنگرەی بۆ دەبەسترێ، چاو گێڕانەوە بە ڕابردوودا، وە نەخشەو پلان دانان بۆ داهاتوو، با خوا یاریێ بیهێنینە دی لەم کۆنگرەیەدا.

٢- ئەم کۆنگرەیە لە هەلو مەرجێکی نێوخۆییو دەرەکی هەستیاردا دەبەسترێ. نازانم هەر کۆنگرەی ئێمە وابووە یان کۆنگرەی حیزبەکانی دیکەش وابووە. چ ئەوەی کە دۆستە، دڵسۆزە، بە خەمەوەن، شتمان بۆ

دەنێرن، پێشنیار، تێبینی، کە سوپاسیان دەکەین هی هەمووان، وە چ ئەوانەی کە دوژمنو ناحەزن، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشامان دەکەن، زۆر چاویان لەسەرمانە، پڕوپاگەندەو درۆو دەلەسەی زۆرمان بۆ دەکەن، بۆیە پێویستە وریا بین، هۆشیار بین، بەشێوەیەك ڕەفتار بکەین کە دۆستانمان دڵخۆش بن، وە خەفەتو ناڕەحەتی ناحەزانمان زیاتر بکەین.

٣- بەڕاستی ئەوەی زامنو دەستەبەرکەری ئەوەیە کە ئێمە لە کۆنگرەیەدا سەرکەوتوو بین بریتییە لە کەشو هەوای ئارامو هێمن، جا ئایا کەشوهەوای ئارامو هێمن بە چی بەرقەرار دەبێ؟! بەوە کە وەکو لە ڕێنمونییەکانیشدا باسکراوە، بزانین چۆن قسە دەکەین! چۆن پێشنیار دەکەین! چۆن ڕەخنە دەگرین! چۆن تەعبیر لە بیروبۆچوونەکانی خۆمان دەکەین!.

٤- هیچ گومانی تێدا نیە کە کەموکووڕیی هەیە، لە هەموو لایەکەوە هەیە، لە هەموو ئاستێکدا کەمو کووڕییمان

هەبووە، بەڵکو کەسێك خۆی بەبێ کەموکووڕیی بزانێ، ئەوە گەورەترین کەموکووڕییە، بەڵام لە ڕەخنە گرتنمانداو لە دەستخستنە سەر کەمو کوڕییەکانماندا، پێویستە ئەم ڕێنرووونییانە ڕەچاو بکەین:

أ/ ئاگامان لە نیەتمان بێ، ڕەخنە گرتنەکانمان مەبەستمان پێ چاککردن بێ، بە هاندەری ناوزڕاندنو ناشیرین کردن نەبێ، داخی دڵی خۆ پێ ڕشتن نەبێ.

ب/ شێوازی دەربڕینەکانمان جوان بن، خوا دەفەرموێ: ﴿... وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا ...(٨٣) البقرة﴾، واتە: لەگەڵ خەڵکیدا بەگشتی (واتە: خەڵکی کافریش) قسەی باش بکەن! ئەدی لەگەڵ براو خوشکانی خۆماندا نابێ قسەی باش بکەین؟!

ج/ وە پێویستە ئاگاداری ئینصافو دادگەریی بین، هەرکەسێ کە قسەی دەربارە دەکەین، تەنیا کەمو کوڕییەکانی نەبینین، چاکەکانیشی بێنینە بەرچاوی خۆمان.

د/ وە پێویستە بەبێ زانیاریی‌و شارەزایی حوکم بەسەر کەسدا نەدەین.

هـ/ گۆڕانکاریی پێویستە، وەکو زۆرجار گوتوومە جەستەی ئینسان بەردەوام گۆڕانکاریی تێدایە. خانەکان دەمرن، خانەی دیکە شوێنیان دەگرنەوە. وە ژیان بەبێ گۆڕانکاریی بۆگەن دەبێ، بەڵام دەبێ بزانین، یەکەم: چی دەگۆڕین؟ دووەم: چۆنی دەگۆڕین؟ سێیەم: بۆچی دەیگۆڕین؟ چوارەم: بەچی دەیگۆڕین؟

دەبێ وەڵامی ئەو چوار پرسیارە بدەینەوە: چی دەگۆڕین؟ چۆنی دەگۆڕین؟ لەبەرچی دەیگۆڕین؟ وە بەدیلەکەشت چییەو بە چی دەیگۆڕی؟ هەمیشە گۆڕانکاریی دەبێ لە خراپەوە بۆ چاك بێ، یاخود لە چاکەوە بۆ چاکتر، نەك هەر لەبەر خودی گۆڕانکاریی گۆڕانکاریی بکەین، دیارە ئەوە شتێکی بێ ئەنجامە.

و/ لەکاتی خستنە ڕووی پرۆژەو پێشنیارەکاندا ڕەچاوی بارودۆخی سیاسیی‌و ئابووریی خۆمان بکەین یانی:

وێڕای باری درێژی، باری پانیشمان لەبەرچاو بێ.

هەیە پرۆژە پێشنیار دەکا، با ئەو شتە بکرێ‌و ئەوە بکرێ، با ئەوەش بکرێ، بەڵام ئاگای لێ نیە بودجەی حیزب چەندە، ئیمکانییەتمان چەندە، هەلومەرجی سیاسییمان چۆنە؟ پێویستە ئەوانە هەمووی بخوێنینەوە.

ژ/ ڕێڕەوونیی حەوتەم‌و کۆتایی: هەڵبژاردنی ئەندامانی سەرکردایەتی کە یەکێکە لە پرۆسەکانی نێو کۆنگرە، بریتیە لە ئەمانەت پێ سپاردنی خەڵکێك کە دەمانەوێ بۆ چوار ساڵی داهاتوو سەرپەرشتی ئەم کارو کاروانە ئیسلامییە بکەن، ئەوەش بریتییە لە ئەمانەت پێ سپاردن، جا خوا (سبحانه‌و تعالى) لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ...﴿٥٨﴾ النساء﴾، واتە: خوا فەرمانتان پێ دەکات سپاردەکان بە خەڵکی خۆیان بسپێرن. ئیبن

تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێ‌و زانایانی دیکەی بواری سیاسەتی شەرعیی، دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە ئەمانەت بە پلەی یەکەم ئەرك‌و بەرپرسیارێتییە، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿...وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ ...﴿٥٨﴾ النساء﴾، واتە: خەڵکینە! ئەمانەتی حوکمڕانیی بە خەڵکی شایستە بسپێرن، حوکمڕانەکان ئێوەش دادگەر بن.

ئنجا پێویستە ئاگامان لێبێ، کە پێ‌سپاردنی بەرپرسیارێتی بە کەسێك کە بە شایستەی نازانی، لەبەر ناسیاوێتی، لەبەر ناوچەگەریی، لەبەر هاومەشرەبیی، لەبەر هەرهۆیەك غەیری شایستەیی، بە خیانەت دادەنرێ، وە هەر کاتێکیش ئەمانەت خیانەتی تێدا کراو زایە کرا، ئەو شتە کۆتای پێدێ.

پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((اذا ضيعت الأمانة فانتظر الساعة، قال: وكيف إضاعتها؟ قال: اذا وَسِّدَ الأمر الى غير اهله فانتظر الساعة)) رواه

البخاري، واتە: هەر کاتێك سپاردە زایە کرا، چاوەڕێی قیامەت بکە- واتە قیامەتی ئەو کارەی کە بە کەسێکی نائەهل سپێردراوە-گوتیان: ئەمانەت بە زایەدان چۆنە؟ فەرمووی: هەر کاتێك کار بە غەیری خەڵکی شایستەی خۆی سپێردرا ئەوە (بریتییە لە فەوتاندنو بە زایەدانی ئەو ئەمانەتە) چاوەڕێی قیامەت بکە.

ئنجا کەسانێك کە ئێمە پێویستمانن بۆ قیادە، لە هەموو ئاستەکاندا، چ لە سەرکردایەتی، چ لە هەر ئاستێکدا، پێویستە ئەهلی قوەتو ئەمانەت بن: ﴿...إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ القصص﴾، وە پێویستە ئەهلی پارێزکارییو زانیاریی بن: ﴿... إِنِّى حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ يوسف﴾، وە پێویستە ئەهلی صەبرو یەقین بن: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ السجدة﴾، بە واتایەکی کورت: پێویستە شایستە بن بۆ ئەو کارەی کە پێیان دەسپێرن.

کۆتا قسەم لە خزمەتتاندا ئامادەبووانی بەڕێزی کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی! ئەوەیە کە ئێمە وریا بین، وەك عادەتی دۆزەخییەکان نەکەین، دۆزەخییەکان خوا (سبحانەو تعالی) لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٣٨)دا لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿ ... كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ ... ﴾، واتە: هەرکاتێك کۆمەڵێك هاتنە دۆزەخ لەعنەت لەوەی پێشێ دەکات.

بەڵێ با وریا بین ئەو وەسفەی کە خوا کافرەکان، مونافیقەکان، موشریکەکان، دۆزەخییەکانی پێ وەسف دەکات، خۆمانی لێ دوور بگرین، جا ئەم سیفەتە یان هەر سیفەتێکی دیکە، بەڵکو هەوڵ بدەین ئێمە ئەو سیفەتە بەرزە لە خۆماندا بێنینە دی کە خوا (سبحانەو تعالی) شوێنکەوتووانی موهاجیرانو ئەنصارییەکانی پێ مەدح دەکات، کە دەفەرموێ چی؟ لە ئایەتی ژمارە (١٠)ی سوورەتی (الحشر)دا پاش ئەوەی لە ئایەتی (٨و ٩)دا باسی کۆچکەران دەکاو باسی پشتیوانان دەکا

دەفـەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾ الحشر، دەڵێن: پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەمان خۆش بـە کـە بـە ئیمانـەوە لـە پـێش ئێمـەدا ڕابـردوون، (لـە پـێش ئێمــەدا کاریــان کــردوە، جوهــدو جیبهادیــان کــردوە، خەباتیان کردوە، خوایـە لێمـان ببـوورە) وە بـوغزو کینـە مەخەرە دڵمـان لەبەرامبـەر ئەوانـەدا کـە ئیمانیـان هەیـە، (ڕقمان لێیان هەڵنەستێو دڵمان پاککەرەوە لە ئاستیان) پەروەردگارمان تۆ زۆر میهرەبانیو زۆر بە بەزەییت، واتە: ئێمــەش وا لــێبکە میهرەبـانو بـە بـەزەیی بـین لەگـەڵ براکانمان، لەگەڵ خوشکەکانمان، لەگەڵ پێشووەکانمان.

هەڵبەتە ئەگەر هەندێ شتیشم نەبیستبایە کـە بـە دوور لە ئینصافم بینی لە چەند کەسێك، چەند کەسێکی کـەم، بەرامبـەر بـە سـەرکردایەتی پێـشووو مەکتـەبی سیاسـیی پێشوو، ئەم قسەیەی ئێستام نەدەکرد.

منیش لە كۆتاییدا دەڵێم:

(ربنا اغفر لناء لإخواننا الذین سبقونا بالإیمان ولا تجعل فـي قلوبنا غلاً للذین آمنوا ربنا انك رؤوف رحیم).

وە داوای لێبــوردنم لــە هــەموو لایــەك هەیــە، گــەردنم ئازادكەن لەو حەقانەی كە هی ئێوەیەو كەوتۆتە لای مـن، خوا بمان بەخشێ، داوای لێبوردن پێشێ لـە خـوا دەكـەم ئنجا لە ئێوە، وە ئێوەش هەمووتان لای منــەوە گەردنتان ئازاد بـێ، خـوا لێتـان ببـوورێ لـە هـەر حـەقێكی مـن كـە كەوتۆتە لاتان.

وصلى الله على محمدو على آله وصحبه اجمعین

والحمد لله رب العالمین.

ئەم نامیلكەیەی بەردەستتان دەقی ئەو وتارەیە كە لە كـۆنگرەی دووەمـــی كۆمـــەڵی ئیـسلامیی دا وەك ڕاپـۆرتێكی ئیمـانیو سیاسـیو فیكریـی بـەناوی مەكتەبی سیاسییەوە پێشكەشم كرد.

شایانی باسە كە لەبـەر كـەمیی كـاتی تـەرخانكراو نـەگونجاوە بـەتێرو تەسـەلیی قسە لەسـەر بابەتـەكان بكەینو زیاتر بە كـورتی پـوختیو گوشـراویی قسە كـراوەو شـەرحو شـیكردنەوەی زیـاتری بابەتـەكان حەواڵـەی عـەقڵو سـەلیقەی خۆتـانو ئـەو كتێـبو بەرهەمانەم دەكەم كە لەو بابەتانەوە خستوومنەڕوو.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net